تصوير ابو عبدالرحمن الكردي
دارستانەکە
٩
کۆمەڵە چیرۆکێکی منداڵان
سمۆرەی فێڵباز
دان بە تاوانی خۆیدا دەنێ
منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com
دانانی: واریسی ئەلکەدی
وەرگێڕانی: ئەحمەد زەردەشت
دیزاین و جێبەجێکردن: کۆمپانیای نوور

# سمۆرەی فێڵباز

## دان بە تاوانی خۆیدا دەنێ

ناوی کتێب: سمۆرەی فێڵباز دان بە تاوانی خۆیدا دەنێ
دانانی: واریسی ئەلکندی
وەرگێڕانی: ئەحمەد زەردەشت
هەڵەچن: ڕەووف مەلایی
بڵاوکراوەی: بوراق بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
دیزاین و جێبەجێکردن: کۆمپانیای نوور
نیگار: فیردۆس مونعیم
ڕەنگی ژمارەیی: هودا نەعیم
سەرپەرشتی هونەریی : محەمەد ئەلقاسمی
تیراژ: ٥٠٠٠ دانە
ISBN: ٩٧٨-٩٦٤-١٩٢-٣٥٠-٣
چاپی یەکەم ٢٠١١


**ژمارەی سپاردن بە دەزگای کتێب و بەڵگەنامەکان- بەغدا (١٤١٣) ساڵی ٢٠٠٩**

Web site: www.alburagh.com E-mail: Info@alburagh.com

لەم دارستانەدا، کۆمەڵێ ئاژەڵ پێکەوە دەژین و یارمەتی یەکتری دەدەن بۆ بنیاتنانی دارستانەکەیان، ئەڵبەتە هەندێکیان زەوی دەکێڵن و دەیچێنن و هەندێکیان جۆگەلە و ڕێگاوبان چاک دەکەن، هەمووان بە کۆشش و ڕێکوپێکی و هاریکاری یەکتری کار دەکەن، سمۆرەیەکی بچووک، یەکێکە لە دانیشتوانی دارستانەکە و لە درزی کلۆری دارێکی گەورەدا دەژیا. ئەڵبەتە ئەم وەکوو ئاژەڵەکانی نیو دارستانەکە زیت و چالاک نەبوو.. تەمەڵ و تەوەزەل و عەبە خەو خۆش بوو، ئەگەر چی هاوکات دەیویست ئاژەڵەکان ستایشی بکەن و ڕێزی لێنێن و بە پێشەنگی خۆیانی دانێن.

هـەر بۆیـە بیری لەوە دەکردەوە چـۆن بەو ئامانجەی بگات، بیری لەوە کردەوە و کە کارێکی وا بکات سەرنجی ئاژەڵەکان ڕاکێشێ و ڕێزی لێ بنین و بە شان و شکۆیدا هەڵدەن، لەبەر خۆیەوە وتی: هەی هـەی.. بەنهێنـی هەندێ شـتی دارسـتانەکە تێک دەدەم و پاشـان لە بـەر چاوی هەمووانـەوە چاکی دەکەمەوە، ئەوسـا بە ئاژەڵێکی بەکەڵک لە قەڵەم دەدرێم، لە نیوەشـەودا کاتێک هەمووان نوستبوون سمۆرە بە تەورێکەوە چووە لای پردەکەوە و هەندێ لە تەختەی پردەکەی شکاند بە جۆرێک دەلاقەی تێ خست و ئینجا بە گژوگیا دایپۆشی و بە پەلە گەڕایەوە کونەکەی خۆی.

بەیانی لە قەراغ جۆگەلەکە دانیشـت گوایـە ماسـی دەگـرێ، ئاژەڵە بچوکـەکان بـە جانتـای قوتابخانەوە هاتن لەو پردەوە بپەڕنـەوە، کاتێـک کـە هەنگاویـان نایـە سـەر گژ و گیاکـە.. یەکێکیـان کەوتە ناو ئاوەکەوە.

سمۆرەی فێڵباز خیرا ورچە بچوکەکەی لە خنکاندن ڕزگارکرد، هەندێ لە دانیشتوانی دارستانەکە و کەس‌وکاری ورچۆلەکە سوپاسی سمۆرەکەیان کرد... ئینجا پردەکەیان چاک کردەوە، سمۆرەکە هەستی بە شانازییەکی ساختەکرد، لە ناخی خۆیەوە گاڵتەی بە ئاژەڵەکان دەهات، کە باوەڕیان پێ کردووە.

دیسانەوە لە تاریکە شەودا، سمۆرە فێڵبازەکە بە دزییەوە خۆی کرد بە عەماری شیری دارستانەکەدا، هەندێ گژوگیا و کرمی فڕێدایە شیرەکەوە. بۆ بەیانی ئاژەڵەکان هاتن شیر بخۆنەوە کە سەیریان کرد شیرەکە پیس بووە، هەواڵ گەیشتەوە سمۆرەکە ئەمیش لە بەردەم هەمووواندا ئاگری لە ژێر مەنجەڵە شیرەکان هەڵکرد، تا کەوتنە قوڵپەقوڵپ و پاک بوونەوە لە مێکروب و جڕ و جانەوەر، ئینجا شیرەکەی بەسەر ئاژەڵەکاندا دابەش کرد سوپاسیان کردو هەندێ دیاریی پێشکەش کرا و بەچاوێکی دڵسۆز و بوێرەوە سەیریان دەکرد...

لە ڕۆژی ئایندەدا سمۆرەکە چووە لای خاتوو ئاسک و پێی گوت: دەبینم لاواز و هیلاکی، چیتە؟ ئاسکۆڵە وتی: من توو دەوەشێنم و بەرهەم دروێنە دەکەم و بەم کارەم خۆشحاڵم، لەگەڵ هاوڕێیانمدا، کە کەری هاوڕێم زەوی دەکێڵێ و دادە بزنی دەستە خۆشکم ئاوی کێڵگەکە دەدات، سمۆرەی فێڵباز پاش بیرکردنەوە وتی: تۆ لەوان زیاتر کار دەکەیت، ئەگەر چی ئەوان لە تۆ زیاتر دەخۆن، خاتوو ئاسکۆڵە دڵزویر بوو وای لێهات باوەڕ بە قسەکانی سمۆرە بکات، کەوتە بیرکردنەوە و خۆی بە ستەم لێکراو دانا و ئەڵبەتە دەبێ بەرگری لە مافی خۆی بکات.

ئەو شەوە ئاسکەکە بەغەمناکی گەڕایەوە ماڵ و تەنانەت نانی ئێوارێشی نەخوارد، کەرەکە پێی گوت: هاوڕێم چیتە بۆ نان ناخۆیت؟ ... وتی: من دەمەوێ جێ گۆڕکێی کارەکانمان بکەین و بەشی خواردنم زیاتـر بێـت. کـەر و بزنەکـە ڕازی بوون، بەیانـی کەرەکە تووی وەشـاند و بزنەکە بە داسـەکەی دروێنـەی کرد، لەپڕێکا پەلی خـۆی زامدارکرد، چونکە بەو کارە ڕا نەهاتبوو، کەرەکە هەڵی گرت و گەیاندییە نەخۆشـخانە، بەڵام ئاسـکەکە هەر چەند ئاوی دەگواسـتەوە و بەسـەر پشتییەوە دەڕما و دەڕژا، ئەو ڕۆژە بێستانەکە بێ ئاو مایەوە... ئەویش هەمووی بەهۆی پیلانی بەدی سمۆرەوە

سمۆرەکە لە نەخۆشخانە سەردانی بزنەکەی کرد ئاسک و کەرەکەی لێ بوو، سڵاوی کرد.. وتی: چۆن ئـەوە ڕوویـدا، کەرەکە وتی پێکەوە هەر کەسـەو خەریکی کاری خۆمان بووین و بەهاوسـانی بەشـی خۆمـان وەر دەگرت، بەڵام ئاسـکۆڵەی هاوڕێمـان داوای ئاڵوگۆر پێکردنـی کارەکانمانی کرد، ڕازی بووین، ئەنجامەکەشـی وەک دەبینی هیچمان نەیتوانی کارە تازەکەی خۆی بەسـەر بەرێ. سـمۆرەکە وتی: کە واتە چارەسەرەکە ئاشکرایە، دەبێ هەر کەسەو بچێتەوە سەر کاری خۆی... ئەمانیش بڕیاریان دا هەرکەسـەو بچێتـەوە سـەرکاری خـۆی... بەڵام ئاسـکۆڵە هەڵوێسـتەیەکی کرد و هەڵوێسـتی سمۆرەی بەلاوە سەیر بوو، کە هەر خۆشـی هانـی ئەوەیدا کارەکـەی بگـۆڕێ و بەشـە خۆراکەکـەی زیادکات

چەندین ڕووداو لە دارستانەکەدا ڕوویان دا، ئەوە بوو سەر گەورەکانی دارستانەکە کۆبوونەوە تا بزانن لەبەر چی ئەو دارستانەیان نائارام بوو، لەوکاتەدا ئاسکەکە هاتە لای مام شێر و سەرگوزوشتەی خۆیانی بۆ گێڕایەوە کە چۆن بە پیلانی سـمۆرە فێڵبازەکە ئاژاوە و ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە، لە پێشـا مام شێر باوەڕی نەکرد چونکە سـمۆرەکە بە دڵسـۆز وجوامێر ناوی دەرکرد بوو، بەڵام ئاسکەکە سوور بوو لە ئاست وتەکانیدا، هەر بۆیە مام شێر بیری کردەوە و وتی: بە نهێنی هەندێ ئاژەڵان دا دەنێین بۆ بە دوادا چوونـی و بـە کامێـرا وێنەی کردارەکانی بگرن و بزانن سـمۆرەکە چـی دەکات، هەمووان ئەو ڕایەیان پەسەندکرد.

سمۆرەکە خۆی و تەورەکەی چووە دەرێ و بەبێ ئەوەی ئاگادار بێ کەروێشک و ڕێویەکە دوای کەوتن، گەیشتە دەوروبەری دارستانەکە و بە مەبەستی گۆڕینی ڕێڕەوی جۆگەلەکە دەستی کرد بە هەڵکەندن، تا ئاوەکە نەچێتە سەر کێڵگە و بێستانەکان و ئاوەکە بەفیڕۆ بڕوات و ڕێگای دەرچوون و چوونە ژوورەوەی دارستانەکە ببڕێ.. کەروێشک و مام ڕێوێ دڵنیا بوون لەو کردارەی کە وێرانکارییە، هەر بۆیە خێرا بە مام شێریان گوت، ئەمیش بەلایەوە سەیر بوو، بڕیاری‌دا کە سمۆرەکە دەستبەسەر بکرێ وسەبارەت بە کێشەکانی ناو دارستانەکە لە بەردەم ئاژەڵاندا لێکۆڵینەوەی لە گەڵدا بکرێ.

بەیانی ڕۆژی ئایندە، پادشـای ئاژەڵان مام شـێر لەگەڵ ورچ و پڵنگ و بە ئامادەبوونی زۆربەی ئاژەڵان کۆبوونەوە و سـمۆرەکەیان بە پەلبەسـتراوی هێنا، مام شـێر بە سـمۆرەکەی گوت: بۆچی ئەو کارەت کرد؟ ئەی تۆ ئەندامی ئەم دارسـتانە شـادومانە نیت؟ بەڵێ شـێری گەورەم من یەکێکم لە دانیشتوانی ئەم دارستانە، بەڵام تەمەڵ و تەوەزەل بووم و حەزم دەکرد هەمووان بە چاوی ڕێزەوە سەیرم بکەن، هەر بۆیە ویسـتم پاڵەوانی بنوێنم، ئەوە بوو ئەو کارانەم بە خەیاڵدا هات تا سـەرنجی هەمووان ڕاکێشم، بـەڵام ئێسـتا دان بـە هەڵـەی خۆمـدا دەنێـم و داوای لێبوردنتان لێدەکـەم و پەیمان بـێ بە هەموو توانایەکمەوە هەوڵدەم بۆ پاک کردنەوەی دارستانەکەمان.. مام شێر وتی: دەتبەخشین و بوارێکی‌ترت دەدەینێ تا ئەوە بسـەلمێنی، خۆ ئەگەر گەڕایتەوە بۆ کارە بەدەکانت، ئەوا سـزاکەت دووجـا دەبێ، سـمۆرەکە دەسـتی کرد بەپـاک کردنەوەی دارسـتانەکە لـە هەندێ داری وشـک و چیلکە و ڕێکخسـتنی ئاودێری، هێمنی و هێوەری گەڕایەوە بۆ دارستانەکە.

پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ

"دان بە هەڵەدانان
بەخشندەییە"

هاورێی ئازیزم

سمۆرە فێڵبازەکە بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن
خۆشەویســت و بوێر و جوامێر بێت، ئەم بیرەش ڕاســت و ڕەوایە،
پێویســتە لەســەر هــەر مرۆڤێــک هەوڵی بۆ بــدات و لــە نێــو برادەرەکانیدا
خۆشەویســت بێت، بەڵام جۆری بۆچوونی سمۆرەکە هەڵە بوو.. ئەوە بوو بە دزییەوە
شتی بەد و خراپ، وێرانکاری دەکرد و لە بەرچاوی ئاژەڵەکاندا ئەوکارەی چاک دەکردەوە
یا جوامێرییەکی دەنواند بۆ ئەوەی سەرنجیان ڕاکێشێ کە گوایە ئازا و بە سوودە. خۆ ئەگەر
بە دڵســۆزی لەگەڵ هاورێکانیدا کاری بکردایە ئەوا بە ڕاســتی ئازا و بوێر و دڵسۆز دەبوو.
بــەڵام ســمۆرەکە هەســتی بــە هەڵــە و تاوانی خۆی کــرد و لە بەردەم مام شــێر و
ئاژەڵەکانیتردا بەڵێنیدا کە جارێکیتر ئەو کردەوانەی لێ نەوەشێتەوە. ئەڵبەتە
دان بە هەڵەدانان شتێکی باشە و کارە هەڵەکە لە بیر دەباتەوە...
ئەی هاورێیان وا نییە؟

## ناونیشانی چوارگۆشەکان

أ ب ج د هـ و ز ح ط ي

١ ٢ ٣ ٤ ٥ ٦ ٧ ٨ ٩ ١٠

ح ٥